# چۆن دەبیتە باشترین هاوڕێی خۆت؟



## باوەڕبەخۆبونی خۆتان زیادبکەن







........ وەرگێڕانی: فاتمە ئەدهەم عەلی

........ میلدرد نیومن ـ برنارد برکوویتز ـ چین ئەوئن

# چۆن دەبیتە باشترین ساوڕێی خۆت؟

## باوەڕبەخۆبونی خۆتان زیادبکەن

نوسینی
میلدرد نیومن-برنارد برکوویتز-جین اوین

لەفارسیەوە:فاطمە ادهم علی

چاپی یەکەم

سلێمانی......................٢٠٠٩

لەبڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما

زنجیرە(٢٢٢)

ناسنامەی کتێب

ناوی کتێب:چۆن دەبیستە باشترین هاوڕێی خۆت؟

بابەت: دەروونزانی

نوسینی: میلدرد نیومن-برنارد برکوویتز-جین اوین

وەرگێڕانی: فاطمە ادهم علی

تایپ و هەڵەبڕ : وەرگێڕ

دیزاین و بەرگ: فواد کەوڵۆسی

شوێنی چاپ: چاپەمەنی گەنج

ساڵی چاپ: ٢٠٠٩ سلێمانی

نۆرەی چاپ: چاپی یەکەم

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

ناونیشان: سلێمانی ـ بازاڕی سلێمانی ـ بەرامبەر بازاڕی خەفاف.

ژمارەی مۆبایل: (٠٧٧٠١٥٧٤٢٩٣), (٠٧٥٠١١٩١٨٤٧)

## پێڕست


لەبارەی نوسەرانەوە.............................. ........................٥
وتەی چەند بیرمەندو رۆژنامەیەکی جیهانی بەناوبانگ سەبارەت بەم کتێبە.....٧
پێشەکی.........................................................١١
گفتوگۆ.........................................................١٥

# لەبارەی نوسەرانەوە:

میلدرد نیومن و برنارد برکویتز هاوسەری یەکن، هەردوکیان شارەزاو پسپۆرن لەبواری دەروونناسیدا. لەشاری نیویۆرك بەهاوكاری یەكتر كاردەكەن لەوبوارەدا، هەردوكیان ئەندامی ئەنجومەنی نەتەوەیی دەروونناسین و شیكاری بۆ چارەسەركردنی نەخۆشیە دەرونیەكان لەئەنجومەنی دەروونناسی ئەمریكاو ڕێكخراوە پسپۆری و پیشەییەكانی تر.

میلدرد نیومن خاوەنی بروانامەی ماستەرە لەدەروونناسیدالەكۆلێجی هانتر، خاتوو میلدرد چەندساڵێك لەلای كۆچكردوو "تونودوریك" خولی فێركاری خوێندووە هەروەها خولی فێركردنی دەروونناسی لەئەنجومەنی نەتەوەیی دەروونناسی بۆ نەخۆشیە دەرونیەكان بینیوە, ئەو بەرپرسی بەشی نەخۆشیە دەرونیەكانە لە ناوەندی ڕاوێژكاری لەشاری

نیویـۆرک، گوڵبـژێرێك لـەكارەكانی كـراون بـەكتێب بـەناوی "شێوازە نوێكان بۆ یارمەتیدانی منداڵ".

برنـــارد برکـــویتز، خـــاوەنی بروانامـــەی ماســـتەرە لەدەروونناســـیدا لـــەزانكۆی كۆلۆمبیـــا، دكتـــۆرای لـــەزانكۆی نیویـــۆرك لەهـــەمان بـــواردا، هـــەروەها لەپـــەیمانگای"ئالفریـــد ئـــادلر"ناوەنـــدی فێربـــوونی تـــەواوكاری بـــۆ تەندروســـتی دەرونـــی بەشـــداری دەكـــات. ئـــەو ئەنـــدامی كۆلێـــژی شـــارو كۆلێـــژی مـــافی ســـزادانە لـــە زانكـــۆی نیویـــۆرك و خـــاوەنی ژمارەیـــەك ووتـــارە لـــە رۆژنامـــەو گۆڤارەكانـــدا بـــڵاو كراونەتەوە.

جـــین ئـــوین، لەنیوجرســـی گـــەورە بـــووەو بروانامـــەی ماســـتەری هەیـــە لـــەبواری فەلـــسەفەدا لـــەزانكۆی كۆلۆمبیـــا،و لەكـــەناڵێكی تەلەفزیۆنیـــدا كاردەكـــات وەك لێكۆڵـەر، وبۆرێكخراوێـك هەڵـسەنگاندنی گـشتی دەكـات و وەكـو نوسـەرێك لـەبواری هەڵـسەنگاندا كاردەكـات، خێـزان دارەو لـــەنیویۆرك نیـــشتەجێیە و وەكـــو رۆژنامەنوســـێكی ئازاد كاردەكات .

## وتەی چەند بیرمەندو ڕۆژنامەیەکی جیهانی بەناوبانگ سەبارەت بەم کتێبە:

*تائێستا بوارێک نەرەخساوە کەوەکو کتێبکی چۆن باشترین هاوڕێی خۆت بیت؟ سادە، کاریگەرو خێرا وکارتێکەر بێت. کاتێ دڵتەنگم ڕۆژی دووجار هاورێ لەگەڵ پەرداخێك ئاو، ئەو دەخوێنمەوە، ئەم کتێبە هەمیشە گیان بە من دەدات. نیل سیمون

* دەمەوێ بڵێم ئەم کتێبە موعجزەیە. بەلآم خاڵی بنەرەتی ئەمەیە کەموعجزەیەك بونی نی یە. کەواتە بهێڵن بڵێم کەبەبێ ئەم کتێبە ناتوانم بژیم. نورا افرون

****لەڕۆژگاری ژیانـدا کەکێشەونیگەرانی زۆرم هەبوە ئەم کتێبە بۆمن وەکونەسیمی کوێستان بووە.***

*"بری برنسون"*

*ئــەم کتێبــە خواردنەوەیەکــە بۆمانــدوبون، بێــزاری، یائس، نائومێدی وتەنیاییە.

"لوس انجلوس تایم"

* نوســــەرانی ئــــەم کتێبەبــــەزمانی ســــادەو رونــــی دەکەنــەوە کەهــەر مرۆڤێـک توانــاو هێـزی زاتــی شــادبون، نەخـشە کێـشانی سـۆزداری وهەسـت کردنـی هەرچـی زیـاتر ئامادەگی بەهێزی خۆی هەیە.

" اخبارکلوب کتابماه "

* ئــەوەی "نیــومن و برکــوو یتــز" کردویانــە، شـێوەی لەبیرکراوی گۆرینی ئینسانی یە بەناوی (من بناسە).

"شیکاگو تریبۆن"

*ئــەم کتێبــە چــەندجار بخوێنــەرەوە. بەراسـتی چـێژ بەخـشە وخوێنەرلــەوە سەری‌سور دەمێنــێ بـۆ شـڵە ژان وسەرشـۆری یـەکانی هۆکـاری لـۆژیکی بـونی هەیـە هەسـتی بێخەمی وئارامش دەست دەکەوێت.

"هارتفورد کورانت"

*ئـەم کتێبـە جۆرێك گفتوگۆی پـر شـەوقی دەروونناسـی یـە بەپەیوەنـدی کـردن لـە گـەڵ کەسانێکە کـەبۆ دیتنـی پێـوانی ئوتۆمبێـل، عـەقڵ وئـارامی یـان هەیـە، بـەڵام ئـەرکی ئەمـە بـەخۆ یـان نـادەن تافێرببنکەچـۆنیەتی خۆیان بەڕێوە ببەن.

"نیورك تایمز"

*ئـەم کتێبـە دەسـتورێکی کرداریـیە بۆیـار مـەتی دانیخـەڵك تاژیـانی پرلـەمانایان هـەبێت وبوێریـان پـێ دە دەن تا سەربکەون بەسەر بەربەستەکانی خۆشحاڵیان.

"اوکلندتریبون"

*ئـەم کتێبـە بەدەرەلـە زاراوەی دژواری دەروونناسـی و وبەشێوەی پرسیارووەڵامە.

"هوستون کرونیکل"

*ئامۆژگـاری شـیاو لـەبارەی ئـەوەی کەچـۆن قۆنـاغی منـداڵی ببەینەسـەر، خودیـەتی وپێگەیـشتن پێـشوازی لێبکەین ولەسەر پێی خۆمان بوەستین.

"دالاس تایمز هرالد"

# پێشەکی

کـاتێ کـە ئـوروون‌دەڵێـت: زۆربـەی خـەڵکی تەمـەنیا ن لەگـەڵ گیرۆدەیـی خـامۆش دەبەنەسـەر، نـاتوانن پـێش بینـی بکـەن کەئـەم گیرۆدەیی یەچـەندە پرهـەراو هۆریایـە. مرۆڤـی ئـەمرۆ لەوانەیـە وەکوباوبـاپیرانی رەنـج ببـات. بـەلاّم لـەبێ دەنگـی وخامۆشـی رەنـج نابـەن. نارەحـەتی وبـێ قـەراری ئێمـە بـەرونی دیـارە وئێمـە لـەبارەی کێشەکانمانەوە گفتو گۆ دەکەین.

لەوانەیـە ئـەمرۆ رێگاکـانی هـەلاّتن چـەندین جـۆر لـەپێش مانابن و ئێمە تامەزرۆیانی دڵ بەدەریا دەدەین.

کارهەمیـشە بەکـەڵك بـووە. بـەلاّم ئـەوەی دەتـوانین بەسـەرگەرمی زۆرپەناببـەین. بەنمونـە: سـواری فرۆکـە دەبـین و لـە وگـۆرە پانانـەی کەدەبنـە هـۆی خۆشـحاڵ نەبونمان را دەکەین.

بەلاَم لەوەش زیاتر ئەوەی ئازاری ئێمەدەدات، لەژێرلێکۆلێنە وەدایە.

ئێمەلەبارەی کێشەکانی دونیا، لەبارەی جەنگ وئازادی مرۆڤ، لەبارەی بەهاکان ودونیای دەرونمان پەرێشان بووە، لەبارەی سەرشۆری، بێزاری و شلەژان، کێشەکانی هاو سەر گیری وپەیوەندی سێکس ونارازی بوونمان لەژیان گفتو گۆ دەکەین.

بەلاَم لەوانەیە لەباوباپیرانمان زۆر نارازی ترو ناخۆشحالتر نەبین.

بەلاَم شتێکی رون و بەلگە نەویست ئەمەیە. ئێمەرەنج وئازارمان بەنێونیشانی مەرجی سروشتی مان وەرناگرین. ئێمە خۆمان بەدەستەوە نادەین، ئەگەر نارەحەت وخۆشحالنین، هەست دەکەین فریویانداوین، لەجێگای هەلەدا بریارماندا وە یان پشت گوێ خراوین، وەکو کەسێك کە ئەنگوستیلەیەکی زێری لەدەست داوە، ئێمە یەکە یەکەیان بەشێوەی گروپ وەکو نارازی بوان ولایەنگرانی ئازادی ژنان، بۆمافی کار کردنی باش لەژیاندا رەزامەندی بەخشین ونارەزایی دەربرین. ئێمە

گەران بەدوای خۆشبەختی دا زۆر بە هەند وەردەگرین وباوەرمان وایە کەشایستەی ژیانی باشترین ئێمە کێشەکانمان دەخەینە روو وەهۆکارەکەشیان دیاری دەکەین: کارمان، هاوسەرمان، وقۆناغی منداڵی خەم هێنەرمان. زۆرێک لەئێمە بۆلەنێوبردنی ئەم هۆکارانە هەنگاو دەنێین. کارەکەمان دەگۆرین، لەهاوسەرەکەمان جیادەبینەوەو بەدوای دەروناسدا دەرۆین.

بەلآم بەم بونەمان، زۆربونی توندو تیژی و نارەحەتی و ئاشکراکردنی رەزامەندی نەبونمان هۆی سەرسورمانمانە. ئایابەراستی هەوڵ وتێکۆشانمان بۆبەنرختر کردنی ژیانمان کردوئێمە قەبوڵمان کردوە کەلەقۆناغی گۆرانکاریەکانی کۆمەلآیەتی دا و لەناوچونی بەهاکان و قۆناغێک کەچانسی مانەوەی مرۆڤ نیە، بەم حاڵەوە دەژین سەبارەت بەنەوەکانی رابردوومافی هەڵبژاردن وهەڵبژاردنەوەی زیاتر مان هەیە، بەلآم بەبێ بونی زیادەرۆیی لەم توانایە بەلانی کەم سودوەرناگرین. بۆچی ئەم کارە ناکەین وەچۆن

دەتوانین ئەم کارە ئەنجام بدەین؟ ئەم پرسیارانەبۆدوودەروونناس، برناردکوویتزا وخاتوو میلدرنیومن١ ژن وپیاوێك کەبەجیاو بە یەکەوە سەرقاڵی یارمەتی دانی خەڵکین. بۆچاکردنی ژیانیان، خراوەتەرووگفتوگۆیەکی توێژنەوەیی یە لەلاپەرەکانی تردا دەیخوێنیتەوە. بۆئەوەی ڕێکخستنی دەقەکان بپارێزین وەلآمەکان لەگەڵ یەکدا ڕێکخراون تاتیێ بگەن کە دەروونناسێك قسەدەکات.

## گفتوگۆ:

***خەڵکی دەڵێن دەیانەوێت شادبن، بەڵام شادمانی ڕاستەقینە وەکو خەونێکی نەبینراو دەبینن، هەموو خەڵکی بەتوندی بەدوای ئەوەوەن، بەڵام زۆربەمان هەرگیز بەم شادومانی یەناگەین.***

***چ هەڵەیەك ڕوودەدات؟ بۆچی زۆرێك خەڵکی گەورە بەشێوەی جۆر بەجۆر نارازین؟***

***ئایاکێشەی دەوران و زەمانەیە کەئێمە تیایدا دەژین؟ یان ئەوەی کە پێشبینی زۆر دەکەین؟ یان بەدوای ئامانجی نادروستدا دەڕۆین؟***

باشەمەرجێکی خراپمانییە. زۆرێك لەخەڵکی ژیانێکی نائاساییان هەیە.ئەوان بەتەواوی دەژین لەسات بەساتی چێژوەردەگرن. بەڵام ئێمەلەبارەی ئەوانەوەزۆر قسە ناکەین چونکەسەرقاڵی ژیانن. ئەوانەبەگشتی لەم

بارەیــەوە ووتــار نانوســن یــان ناچــن بــەدوای دەرونناســدا. لەگـــەڵ ئەمـــەش دا داوایـــەکی دروســـت هەیەوکەســـانێکی زۆر مـــەیلی ژیـــان یـــان نییـــە. خـــەڵکانێی زۆر هێـــشتا بەسەرهونەری شاد بوندا زاڵنەبوون.

***ئێوەئـەوە نـاودەنێن هونـەر، ئایـا بیردەکەیتـەوە ئـەم هونەرە وەکو سەما یان گۆزەگەر شیاوی یاداوەریە.***

***بـەلآم مـن بـیر دەکەمـەوە ئێـوە شـادن یـان ناشـادن! ناتوانن نەخشەیەك بكێشن كەشادبن.***

***دەتــوانن زۆركــار ئــەنجام بـدەن، بــەلآم نــازانم چـۆن دەتوانن شادمانی بەدی بهێنن.***

***دەتـــــوانن بـــــەدوای شـــــتانێکەوەبڕۆن ئومێـــــدەواری هۆیەکــە بۆشــادومانی تــان، بــەلآم تــاپێش بەدەســت هێنانی ئەوانە ناتوانن لەم فەرمانە بەتەواوی دڵنیابن.***

ئــەم فەرمانــە تارادەیــەك دروســتە، بــەلآم بەشــێوەیەك دەبــێ ئێــوە ئەوەبخەنــە روو. بەشــێك لەكێــشەكە ئەمەیــە كەزۆربــەی كەســەكان بــەدوای شــادیەوەن، لەگــەڵ ئــەوەدا دەســتیان لەگیرفانێكدایــە. ئەوانــە بیردەكەنــەوە كەشــتێك بــونی هەیــە ئەگــەر بەئەوبگــەن، دەگەنــە خۆشــحاڵی و

کامــەرانی. ئەوانەچــاوەڕێن شــادی روداوێکیــان بــۆ بێنێتــە پــێش. ســەرنج نادەنــە ئــەوەی کەئەمــە شــتێکە دەبــێ خۆیــان ئــەوە بــەدی بهێــنن. خــەڵکی کێــشەی زۆر قــەبوڵ دەکــەن تــا فێــری زمانێــك یــان هونــەرێك دەبــن. ئەوانــە بۆبەگەرخــستنی ئۆتۆمبێــل خــۆراگرن وتاقــەیان هەیــە، بــەلاّم ئــە رکــی ئەمەبــەخۆیان نــادەن تــافێرببن کەچــۆن خۆیان بەڕێوەببەن.

***ئەمەبیرۆکەیــەکی ســەیرە، ئێوەئەوەبەشــێوەیەکی بــەمێزوولۆژیکی دەخەنەڕوووەکوونــەوەی کەئێمــەکۆنترۆڵی خۆمان بەدەست پیانانێك لەبەردەستابێت.**

***ئایاهونەری ژیان نابێت لەمەسروشتی تربێت؟***

ڕەنگەپێویــست بێــت بــەم شــێوەیەبێت بــەلاّم بــۆ زۆربــەی ئێمــە وانیــە. ئێمەلەگــەڵ ئــەوەی دەزانــین چــۆن پێویــستە بــژین، لــەدایك نــابین وزۆرێــك لەئێمــە، هــەرگیز ئــەم ڕێگەیەفێرنــەبین. بــەلاّم شــتی زۆرهــەیی کەپێویــستە ئەنجام دانی ئەوانە فێر بین.

****بۆنمونە چ شتانێك؟***

یەکـــەمین شـــت کەپێویـــستە بیـــزانین، ئەمەیەکەلەوانەیـــە لـــــەجێگای هەڵـــــەو نـــــەگونجاودا بـــــەدوای ئـــــەوەی کەدەمانـــــەوێت، هـــــەین. سەرچـــــاوەی خۆشـــــبەختی لـــەدەرەوەی ئێمـــەدا نیـــە، بـــەڵكو لـــەناخ ودەرونماندایـــە. زۆرێـــــك لەئێمـــــە هێـــــشتادەستمان بـــــەوە نـــــەکردوە کەســـودوەرگرین لـــە وزەوتوانامـــان، وەلەئاســـتی خـــوار تواناکانمـــان کاردەکـــەین وچـــاوەڕێین تاکاتێـــك کەســـێك کلیلـــی زێرینمـــان پـــێ بـــدات وبیـــدەین بەدەســـتەڵاتی خۆشبەختی، درێژە بەم کارە دەدەین.

پێویـــستە بـــزانین ئـــەم دەســـتەڵاتە لـــەناخ دایـــە وئێمەکلیلی ئەومان پێشتر هەبوە.

وەك چـــاوەڕێین ئێزنمـــان پێبـــدات تابەشـــێوەیەکی تەواوبژین.

بـــەڵام تەنهاکەســـێك دەتوانێـــت وەهائیزنێکمـــان پێبـــدات ئـــــەوەش خۆمـــــانین. ئێمـــــە بۆشـــــتانێك کەلەژیانمانـــــدا ڕودەدەن، تـــــەنیا لەبەرانبـــــەر خۆمانـــــدا بـــــەرپرس ووەڵامـــدەرەوەین. دەبـــێ ســـەرنج بـــدەین کـــەمافی هەڵبژاردنما ن هەیە.

بـــونی لێپرســـراوی بـــاش وهـــەبونی ڕۆژگـــارێکی بـــاش، لەئەستۆی خۆماندایە.

***مێـــــــشتا ســـــــەیر ئێتـــــــەپێش چـــــــاومان. ئەگەرمەموشـــتەکان پەیوەنـــدیان بەئێمەوەمەیـــە، ئەگـــەر بتـــــوانین دوگمـــــەی جـــــادویی بگوشـــــین وخۆشـــبەختی پەیدابکەین، کەواتەبۆچی خەڵکی ئەم کارەناکەن؟***

هـــیچ دوگمەیـــەکیجادویی بـــونی نیـــە. بـــەڵام تێـــی رامـــان بـــونی هەیـــە. بەگرتنـــە ئەســـتۆی لێپرســـراویەتی ژیانمـــان بـــەمانای گۆرانکـــاری بنـــەرەتی لەشـــێوازی بـــەرخوردمان لەگەڵ هەموو تاکەکاندا.

ئێمەهـــەرکارێك کەئـــەنجامی دەدەیـــن تالـــەم گۆرانکـــاری لێپرســـــــراویەتی یـــــە دان بـــــەخۆدابگرین. ئێمەبەلایەکـــــدا دەشـــکێینەوە بۆرەزامەندنـــەبون وخۆشـــخاڵ نـــەبونی خـــود، کەســـێك یـــان شـــتێك ســـەرزەنش بکـــەین تائـــەوەی هـــەنگاو بنێین وهەستی باشترمان هەبێت.

تەنانـــەت ئێمـــە لـــەبارەی هەســـتمانەوە بەشـــێوەیەك گفتوگۆبکـــەین کەئەندێـــشەی ئەوانـــە نامۆیەبـــەم کەشـــە. ئێمـــــەدەڵێن "ئـــــەم هەســـــتە زاڵ بووەبەســـــەرماندا "

هێـــشتالاوازی وناتوانایمـــان تێدایـــە کـــەهێزی تێکـــەڵاو زاڵ بووەبەســـەرماندا. بـــەجێگای ئـــەوەی کـــە بڵـــێین "بـــەم شێوەیەهەســـــتم کــــــرد "شـــــێوەیەك قـــــسەدەکەم کەهێـــشتاهەستمان وەکووگۆرانکـــاری یـــەك کـــەهیچ کاریگەریـــەکی لەســـەرئەوانەنیە لـــەناکاو، لـــەبارودۆخی هەتاوی دابۆتۆفان دەگۆردرێت.

ئـــەم بۆچـــونی کـــەش ناســـی یـــە ســـەبارەت بەهەســـتمان زۆرباشــــــە. چـــــونکەدەبێتەهۆی ئـــــەوەی هەســـــتێك کەهەمانـــەهێواش بینـــەوە. ئێمـــەخۆمان بـــەدوردەگرین، تەنها بەهۆی ئەوە وەکەبواری هەڵبژاردنمان نیە.

*** دەزانـــی وەرگرتنـــی ئـــەم کـــارە کێـــشەیەبۆم. مەبەســـتم ئەوەیە کەهەستی تێکەڵ بون هەیە، لێن ودەچن.***

***ئێمەزۆربـــەی کـــات نـــازانین بۆچـــی ئەگەرلەشـــتێك تـــوورەوبێ تاقـــەتین، دەتـــوانین بەســـەر خۆمانـــدا زاڵ بـــین وشـــتەکان نەشـــکێنین یـــان نـــەگرین بـــەلام نـــاتوانین هەســـت بەغـــەم نەکـــەین یـــان نارەحـــەت نـــەبین. تەنانـــەت دڵنیـــاش نـــــیم کەبمـــــەوێت نارەحـــــەت وناشـــــاد بم. لەگـــــەڵ***

*هەمووئەمەشدا ئەگەرڕووداوێك پێشهات كەئازارم بدات، ئەوكات مافی ئەوەم هەیە كەهەست بەناڕەحەتی بكەم.*

بەڵگەنەویستە كەمافی ئەوتان هەیە. ئێوەلەبەرانبەرهەستی دژبەیەكتان وەكووهەستی شادی یان ناشاد، مافتان هەیە. هەبونی هەستی جۆراوجۆر لەتواناكانی مرۆڤە.

بەلآم زۆربەی كاتی خەڵكی بەهەست كردن بەناخۆشی یەوە وتەنانەت دەچنە پێشوازی ئەوانەوەوبە بۆ ئەوەی سەرنجی تەواویان بدەنێ، هۆكاری سەرهەڵدانی ئەوانە چی دەبێت. كارانێك ئەنجام دەدەن كەهەستی ناخۆشیان بۆدروست دەكەن پاشانیش دەڵێن: "ناتوانین زاڵ بین بەسەر خۆماندا ".

مەبەستی زیاتری خەڵكی لەم رستەیەئەوەیە كەهاوكاری خۆمم نەكردوە ولەدەرەوەی ئیختیارم بوە ". بەلآم ئێمە هەموو دەتوانین بەسەر خۆماندا زاڵبین ویارمەتی خۆمان بدەین.

**ئایا بەراستی دەتوانین؟*

***ئـەم بـیر کردنەوەیـە بزوێنـەرەو دڵ قـەبوڵی دەکـات.***
***دڵـم دەخوازێـت تونـد بـەم بـیر کردنەوەیـەوە بنوسـێت.***
***چۆن دەتوانم ئەم کارەئەنجام بدەم؟***

بـەڵێ، بەشـێوازی جۆربەجۆر، یەکـەم جارپێویستەنەخشەیەکی بنـەرەتی بکێیـشت. ئـەوەی کـەئایا دەتـەوێ پـەروباڵ بدەیتـە خـۆ یائـەوەی کـەخۆت سەرکوت بکەیت؟

ئایالایەنگری خۆتی یان لە

دژی خۆتـان کاردەکـەن. لەوانەیـە پرسـیارێکی سـەیر بێـت بەمێـشکتانا، بـەلأم زۆرێـك لەخـەڵکی بەراسـتی خراپترین دوژمنی خۆیانن.

ئەگـەر پلانتـان هەیـە یارمـەتی خۆتـان بـدەن، دەتـوانن کارانێـك ئـەنجام بـدەن کەببنـەهۆی ئـەوەی کەهەسـتێکی باشـتان هـەبێت، بـەجێگای ئـەوەی کارانێـك ئـەنجام بـدەن کەببنـە هـۆی ئـەوەی سـەبارەت بـەخۆتان هەسـتی خراپتان لەلا دروست ببێت.

کاتێ کەبەم ئاسانی یە دەتوانن هۆکاری خۆشی ورەزامەندی دەست بخەن ئیتربۆچی دەبێ کارانێک ئەنجام بدەین کەهۆکارین بۆرەنج وئازارمان؟

ئەمە پرسیارێکی گرنگە کەپێویستە لەخۆتانی بپرسن.

خەڵکی لەبارەی پیسبونی هەواوە نیگەرانن. بەلاَم زیانێک کەئێمە بەخۆمانی دەگەیەنین، زۆر ترسناکتر لەوەیە کەزیان بەژینگە دەگەیەنین. پێویست نیە بەرنامەی تی ڤی بیری ئێمە ئالودە بکات، ئێمە خۆمان بەشێوەیەکی کاریگەرتر ئەو پیس دەکەین. پێویست نیە بەکەسێك بڵێین چۆن خۆت ئیهانە دەکەیت. کاتێك خەڵکی بەدوای هەڵەو کەم و کوریەکانیان دا دەگەڕێن، هیچ کێشەیەك بۆ پەیداکردنی ئەوان یان دروستکردنیان نیە. تەنانەت ئەگەر ئەوانە بەراستی بونی دەرەکییان نەبێت.

بۆ زۆرێك لەخەڵکی بەدەستهێنانی لایەنی باشی خۆی کەدەبێتە هۆی ئەوەی سەبارەت بەخۆی هەستی باشی هەبێت، بەراستی کارێکی گرانە وە ئەمە راست

وەکــو ئەوەیــە کــە پــەردەی پەنجــەرە بــەرووی هــەموو روناکیەکدا دادرابێت.

***بــەڵام کەســانێکی زۆر هــەن کەتــەنها خــاڵی باشــی خۆیــان دەبیــنن. ئەوانــە بیردەکەنــەوە، ئــەوەی کەهــەن بەتــەواوی لێــی رازیــن وەئەگــەر کێشەیەك هــەبێت کێشەی کەسانی ترە نەك ئەوان.***

بــێ گومــان. بــەڵام ئەوانــە بەراســتی باوەریــان بــەم مەســەلە نیــە کەســانێك کەبەنارەحــەتی هــەوڵ دەدەن تاخۆیـــان و کەســـانی تـــریش رازی بکـــەن چـــەندە نائاسـاین، شـتێك دەشـارنەوە. ئەوانـە نـاتوانن هەڵـەکانی خۆیـان ببیـنن چـونکە دەترسـن بێجگەلـەم هەڵەیـە شـتی تریـان نـــەبێت. ئەوانـــە بیردەکەنـــەوە یـــان پێویـــستە بەتـــەواوی و بـــێ کـــەم و کـــوری بـــن یـــان ســـەراپا پـــر هەڵەوکــەمی بــن، کێــشەکە لێرەدایــە کەکــەنارگرتن لــەم جـــۆرە تێرامانـــــە ســـــەبارەت بـــــەخود زۆرکێـــــشەیە. چـــــونکەئەوانە لـــــەوەی کـــــەخۆیان بەشـــــێوەیەکی وردتوێژینەوەبکـــەن نایکـــەن. بۆگۆرانکـــاری پێویـــستە

بەشـــێوەیەکی وردتوێژینـــەوەی خۆتـــان بکـــەن تـــادەرك بەهەڵەکانی خۆتان بکەن.

دەبـــێ تواناتـــان هـــەبێت ســـەرنجی ڕێگایـــەك بـــدەن کـــەخۆتانی پـــێ بـــچوك دەکەنـــەوە، پلانێکـــدابنێن چـــونکە ئـــەم کارانـــە شـــتێك نیـــە کەبتانـــەوێت ئـــەنجامی دەدەن، کەواتـــە دەتـــوانن دەســـت پـــێ بکـــەن کەدەبنـــەهۆی گەورەیی ورەزامەندیتان لەژیاندا.

***بۆنمونە چ کارانێك؟**

بۆنمونـــە ســـەرنجی ســـەرکەوتنەکانتان بـــدەن، کـــاتێ کارێـــك ئـــەنجام دەدەن ئەوهەســـتەوە گـــەوریی تـــان پـــێ دەبەخـــشێت ماوەیـــەك لەســـەر ئەوەبوەســـتن. خۆتـــان بۆئـــەنجام دانـــی ئـــەوو، وەلـــەم ئەزمونـــە چـــێژوەربگرن وئەورابکێشن.

ئێمەبەئـــەنجام دانـــی ئـــەم کارانـــە بۆخۆمـــان نـــەك بۆکەســـانی تـــر عادەتمـــان نیـــە. کـــاتێ هەڵەیـــەك ڕوونـــەدات ســـــەرنجی هـــــەموان رادەکێـــشێت، کـــاتێ کارەکـــان بەدروســــــــتی ئـــــــەنجام دەدرێـــــــن، دەبێـــــــت ئێمەبەئاگاییەوەســـــەرنج بدەینەئەوانـــــە. ئەمەپەیوەنـــدی

بەئێمەوەهەیە کەخودیەتی بەرەسمی بناسین. ئەگەر چاوەڕوانبین خەڵکی ئێمەبەرەسمی بناسن وئەمەنەیەتە پێش، ئەوکات هەست بەئازارو نارەحەتی دەکەین وەکاتێکە ئەمەپێش بێت لەوانەیە ئەوەرەت بکەینەوە. شتێك کەکەسانی تر پێمان دەڵێن گرنگ نیە. ئێمە هەمووچاکەمان خۆش دەرێت. ، بەلاّم ئایا هەرگیز سەرنجتان داوە کەروناکی چاکەیەك چەندەخێرا رەنگ دەداتەوە؟ بەلاّم کاتێئێمە، خۆمان باش ئەکەن کاریگەری ئەوەلەسەرمان ئەمێنێت.

بێگومان باشەکە ستایشی خۆمان لەکەسانی تر ببیستین، بەلاّم ئەگەر ئەوەمان پێشتر لەخۆمان بیستبێ، ئیترگرنگ نیە کەخەڵکی ستایشمان بکات یان نا.

ئەم کارە بۆهەندێ لە بێژەرەکان ئەکتە رەکان کەهەمیشە چاوەڕێی بیستنی ستایش کردنن لەلایەن کەسانی ترەوە کارەساتە، چونکە ئەوانە هەرگیز ئەم چاکەو ستایش کردنەیان لەخۆیان نەبیستووە.

***پێشبینی دەکەم ئەمانەوەکو کەسانێکن کەپێویست دەکات شتێك چەند جار دووبارە بکەنەوە. چونکە هەرگیز باوەڕی ڕاستەقینە یان پێی نیە، یان وەکو کەسانێکن کەهەمیشە سەرقاڵی کرینی شتومەکن چونکە لەناخیاندا هەست بەکەمی شتێك ئەکەن. ئەم کەسانەهەرگیز تێرنابن.***

بەڵێ. ئەوانەهێشتا لەگەران بەدوای خواستەکانیاندا دەکەونەهەڵەوە. وەکو"دون ژوان "١ کەلەنێوان ئەوهەمووژنەدا نازانێت بەدوای چی دا دەگەرێت.

کاتێ کەبەم نمونانە زیادەرۆیی دەکەن، بەئاسانی سەرنجی پوچی وبێمانایی ئەوان دەدەین. بەلاَم هەمووئێمە لەوەی کەبەئەندازەی پێویست رێزبۆخۆمان دابنێین، نائومێددەمێنینەوە. ئەگەرکەسێك هەفتەیەك رژێمیخۆراکی بگرێت ورۆژێك بیشکێنێت، وزیادەرۆیی بکات لەخواردندا، لەبەرانبەر لەگەڵ زیادەرۆیی لەپێشتر لەتاوانبارکردنی خۆی گیرفانی دەگرێت شتێك نیە. ئایا ئەو هەفتەیە کەرژێمی هەبووە گرنگی نەبووە بۆی! ئەودەبێت بۆیەك هەفتە رژێم گرتن خاڵ بۆ خۆت

دابنێـــت وپاشـــان دووبارەدەســـت پـــێ بکەیتـــەوە، بەمـــەرجێك کەمەبەســـتی یارمـــەتی دان بێـــت بـــەخۆی، هەڵبەتە لێرەدا داوێك هەیە:

بەئەگـــەرێکی زۆر ئـــەم خواردنەنیـــە کـــەرۆژی هەشـــتەم ئەوگومرائـــەکات تارژێمەکـــەی بـــشکێنێت، بـــەڵکو وەسوەســـەی لـــەناوبردنی ئەوێنەباشـــەیە کەئەولەتـــەواوی هەفتـــەدابۆخۆی دروســـت کردبـــوو. ئەمەشـــتێکە کـــەبۆزۆرێك لەخـــەڵکی قـــەبوڵکردنی ئـــەو کێـــشەیە. ئەمەیـــە کەلـــەبارەی خۆمانـــەوە هەســـتی باشمـــان هـــەبێت. کاتێـــك کەبـــەیانی رۆژی دوایـــی لەخۆتـــدا هەســـت بـــەبێزاری دەکـــەیت، پێویـــستە لـــەخۆت بپرســـیت لـــە چ شـــتێك زیـــاتر چـــێژ وەرئـــەگرم، لـــەوەی کـــەدوێنێ شـــەو رژێممـــان شـــکاند یـــان لەوەی لەبەیانی رۆژی دوای خۆم سەرزەنشت کرد؟

***بـــەڵام ئەگـــەر ســـەبارەت بـــەخۆمان هەســـتی خراپمـــان هـــەبێت، ئـــەو کـــات چـــی؟ئەوە هەســـتێکی راســـتەقینەیە وانیە؟ئەگـــەر کەســـێك بیردەکاتـــەوە کەکەســـێکی خـــراپ و هیچ و پوچە، چۆن دەتـــوانین پێـــی بڵـــێین کارانێـــك ئـــەنجام بدات کەهەستی باش پەیدا بکات؟**

بیردەکەمەوە ئەگەر کەسێك بلێت: "من کەسێکی خراپم وەلەخراپ بونم رازیم، من بخەرە جێگای خۆت" ناتوانم شتێکی زیاتری پێ بلێم. بەلام خۆشبەختانە مەبەستی راستەقینەی ئەمە نیە.

زۆربەی خەلکی لەوەی خۆیان بەدبەخت کردووە، نارازین و هەمیشە دووچاری کێشمەکێشی دەرونی دەبن. بەشێك لەبونی کەسایەتیان سەرزەنشت و ئیهانە دەکەن، بەلام بەشێکی ترلەو هاواردەکات کەئەو پەیوەندی بەئێرەوە نیە.

مەسەلەکە لێرەدایە کەسەبارەت بەخۆیان بەزەیی و میهریان هەبێت. لەبەرئەوەکاتێك کارێك ئەنجام ئەدەن لەناختان هەستی خراپتان بۆدروست دەبێت لەخۆتان بپرسن ئایا ئەمە هەمان ئەو هەستەیە کەئەمانەوێت هەمان بێت؟ئەگەر بەم شێوەیە نیە کە ئەبێتە هۆی ئەم هەستە کۆتای پێ بهێنن. لەکارەکەتاندا گۆران بکەن دەبێتەهۆی ئەوەی سەبارەت بەخۆتان هەستی باش و چاك پەیدا بکەن.

***بۆ نموونە ئەوەی کە ئێوە لە نهێنی زۆر ئاگادارن خەڵکی چ کارێکی تر دەتوانن ئەنجام بدەن؟***

ئەمانە لەراستیدا نهێنی نین. خەڵکی شتی زۆرتر ئەزانن، زۆرزیاترلەوەی حەزدەکەن دانی پیادەنێن. ئەوانە نهێنی لەخۆیان دەشارنەوە. زۆرێك لەوانە زۆرسادەن.

بۆنمونە شتێکی بنەرەتی ئەمەیە کەچاوەروانی وپێش بینی خۆتان بەدەست بهێنن. ئەگەر کارەکانی ماڵە وە، ئەرکی خوێندن یان هەرکارێکی ترتان هەیەبۆئەنجام دانیان دودڵن کەلەژێر باری ئەوانەدا دەرنەچن، بیربکەنەوە کەئەگەرئەوکارانەدوابخەن چ هەستێکتان بۆپەیدا دەبێت؟

ئەگەر بیردەکەنەوە سەبارەت بەخۆتان کەمێك هەست بە بێزاری دەکەن، ئەوەئەوکارەئەنجام بدەن و ئەودوامەخەن. هەستی تەواوکردنی کارچێژ بکەن لەئەزموونی زاڵبوون بەسەرخۆتاندا چێژوەربگرن.

ئەم فەرمانە بەڕاستی شادی بەخشە. ئەرکەکانی ماڵەوە یان ئەرکی خوێندن بەشێکی بچوکی ژیانە،

بەلاّم چۆنیەتی هەستتان سەبارەت بەخۆتان، بەدرێژایی تەواوی ڕۆژ، خودی ژیانە. لەسەرو ئەمەشەوە نەخشەسازی کەلەئەنجامی کارێك، چ هەستێکتان بۆدروست دەبێت لەوانەیە ببێتەهۆی سەرسورمانتان. لەوانەیە جێی سەرنج بێت کەئەنجامدانی کاری تر بێجگە لەکارەکانی ماڵەوە، بەتایبەتی لەورۆژەدا، ببێتەهۆی ئەوەی کەسەبارەت بەخۆتان هەستی باشترتان هەبێت. لەوانەیە پلان دابنێن بەجێگای ماڵەوە شعر بخوێننەوە.

***ئایا ئەم کەسانە بۆخۆویستی هان نادات؟***

*من وێنای ژنێك دەکەم کەبەچاوی درەوشاوەوەشەوکاتێ کەهاوسەرەکەی بەبێ تاقەتی یەوەسەیری دەوروبەری خۆی ئەکات، منداڵ ئەگریت وماڵی شپرزەئەبینێت ولەخێزانەکەی ئەپرسێ!*

*"لەنان خواردن چ خەبەر؟" ژنەکە بەخۆشحاڵیەوە وەرەقەیەك دەهێنێ ودەڵێت: " بەجێگای ئەوەشعرم بۆت نوسیوە "*

بیردەکەمەوە ژنانێك کەرازی بن، بەلانی کەمەوە نەك زیاتر لەیەك جار بەوەها نرخێك شعر بڵێن، زۆرکەمن. کەسانێك کاتێ سەبارەت بەوانی تر بی مەحەبەتبن، بەکەمی سەبارەت بەخۆیان هەستی باش پەیدائەکەن. ئەگەروەهاشتێك پێش هات، لەوانەیەئەوژنە لەشعردانان هەست بەسەربەرزی بکات، بەلام لەهەمان کاتدا چاوپۆشی هەیە وەئەگەر درێژەبەغەریزەی شاعیری بدات، ئەبێت پلانێکی تردابرێژێت.

ئایائەتوانێت هەم شاعیریش بێت هەم بەکارەکانی ماڵەوەشدا رابگات؟

ئەگەرنا، شیعر وتن تاچ رادەیەك بۆی گرنگە؟

ئەگەرشعر وتن زۆربۆی گرنگە، ئەبێت بۆئەنجام دانی پاشماوەی بەرپرسیاریەتی یەکانی تری کەلەئەستۆی دایە، ئەبێ لەهێزێك یارمەتی وەربگرێت. لەوانەیەهاوسەرەکەی بیەوێت لەکارەکانی ماڵەوەیدا زیاترهاوکاری بکات. هەڵبەتەهەندێ هونەر مەندان بەم ئەنجامە دەگەن بۆئەوەی ژیانی هاوسەری یان پێك نەهێناوە دواجار هونەریان هەڵبژاردوە. ئەم

جۆرەهەڵبژاردنــــە. دروســـتە یـــەکێ لەژنـــەکانی "کـــاترین ئـــــانپورترا"١ لــــەبارەی شکـــست هێنـــــانی ژیــــانی هاوســـەریەتیان بەئـــەوی گـــووت:"بـــەڵام تۆلەســـەرەتادا هاوســـەرێکی، دەبێـــت ئێمـــە ئەولەویەتـــەکانمان دیـــاری بکەن ".

زۆرێـك لـەلانگرانی ئـازادی ژنـان دەڵـێن کەسـودوەرگرتن لەپێداویـــستی یـــەکانی بـــەخێوکردنی منـــداڵ ئـــەبێت زۆرســـادەبێت. تادایکـــان ناچـــار نـــەبن بـــەهۆی پاســـەوانی کردنیـــــان لەمنداڵـــــەکانیان لەتـــــەواوی ڕۆژدا لەماڵـــــەوەدا ببەســـترێنەوە. مـــن نـــەیاری دایەنگـــەی منـــداڵان وســـەرقاڵی ژنــــان نــــیم. بــــەڵام بــــون بــــەخاوەن منــــداڵ ئــــەبێ بەهەڵبـــژاردنێك بێـــت. ئەگـــەرژنان حەزئەکـــەن بـــبن بـــەدایك، ئـــەبێ ئـــەم مافـــەیان هـــەبێت، بـــەڵام ئەگەرحەزناکـــەن منـــداڵ بەخێوکـــەن، نابێـــت منـــداڵ یـــان ببێـــت. بـــەڵام ئەگەرمنـــداڵ یـــان ببێـــت پێویـــستە بەرپرســـیاریەتی تایبـــەتی قـــەبوڵ بکـــەن. ئەگەردەیانـــەوێت هـــەم ماڵیـــان هـــەبێت هـــەم لەدەرەوەکاربکـــەن، دەبێـــت لـــەم بارەیـــەوە پـــلان دابنـــێن.

ئەمەقـــەیرانێکی دژوارە وپەیوەنـــدی بەخۆیانـــەوە هەیـــە کەلەبەرپرسیاریەتی ئەوبێنەدەرەوە.

ئەگەربیانـــەوێت دەتـــوانن لەدایـــەنگای منـــدالآن سـودوەربگرن، بـەلآم ئەگـەر ئـەم کارەناکـەن نـابێ هەست بەوە بکەن کەبوونەتەقوربانی.

***بـــــەلآم ئەگـــــەر نـــــەتوانن بەرپرســــــیاریەتی هـــەمووکارەکان بگرنـــە ئەسـتۆ کەئەیانـــەوێت ئـــەنجامی بدەن ناچارن لـەنێوان ئەوانـەدا هەڵبـژاردن بکـەن، چـی؟چ کاتێـک ئــەنجامی کارەباشـــەکان بۆخۆتـــان بـــەزۆرزۆیی دەگۆرێت؟**

ئەنجامـــدانی کارانێـــک کەهەســـتی چـــاکە دەبەخـــشنە ئێـوە، لەراسـتی داخـاڵی بەرانبـەر زیـادەرەوی وزۆرزۆییـە. ئەمەتـــەنیا بـــەمانای رازی بـــونی یـــەك لایـــەن لەخودنیـــە، بەڵکوبـــەمانای رازی بـــونی هـــەموو خـــودە، کـــە ئەمـــەش هەموهەســـــــت و پەیوەنـــــدی و بەرپرســــــیاریەتیەك کەلەبەرانبـــەر خەڵکـدا هەتانـــە دەبێتـــە زۆر زۆیـــی، واتـــە رازی بـــوونی بـــچوکترین بـــەش لەبوونتانـــدا، ئـــەویش بەشـــێوەیەکی کـــاتی. واتـــە بەئەنـــدازەی پێویـــست

خۆویــستبە تــاوەکوو گرنگــی بــەخۆتان بــدەن و چــاودێری لەخۆتان بکەن.

ئەگــەر ئـــەم کــارە فێرنـــەبن، هـــیچ کـــات نـــاتوانن بەدروستی گرنگی بەکەسانی تریش بدەن.

خـوای گـەورە لـەئینجیل دا دەفـە رمێـت: "دراوسـێکەت وەتوخـۆت خۆشـت بوێـت. "نـەك زیـاتر لـەخۆت ونـەك بەجێگای خۆت.

ئەگـــەر نـــەتوانین خۆمانمـــان خـــۆش بوێـــت، خۆشەویستی کەسانی تر دواجار بە کوێ دەگات؟

کەسـانێك کـەخۆیانیان خـۆش ناوێـت، دەتـوانن سـتایش بکــەن، چونکەســتایش کەســەکان گــەورەدەکات وتــاك بـچوك دەکاتـەوە. ئەوانـەدەتوانن سـەبارەت بەکەسـانی تـر شـــەوقیان هـــەبێت، چونکەشـــەوق ومـــەیل لەهەســتکردن بەکــەم وکــووری دەرونیەوەسەرچــاوەدگرێت کەپێویــستی بەتێر بوون هەیە.

بــەلام ئەمانــەناتوانن کەســانی تریــان خــۆش بوێــت، چــونکە عــشق رەزامەنــدی لەســەربونی زیندوولەحالــەتی گەشــەکردندایە کەلــەناخی هەموانــدا هەیــە. ئەگــەر ئــەم

هەستە لەناخ ودەرونی خۆتدانە بێت، ناتوانی بەکەسی تربیەخشیت.

***بەلام دەڵێن چرایەك كەبۆماڵ حەلاڵە بۆمزگەوت حەرامە؟**

بەڵێ، ئێوەدەتوانن بەئاسانی سەرنج بدەن لە جیاوازی نێوان عشق وئەوەی شێوەی لەعشق دەچێت لەپەیوەندی نێوان دایك وباوك منداڵدا. دایك وباوك هەمیشەدەڵێن كەهەركارێك بۆمنداڵەكانیان ئەنجامی دەدەن، لەروی عشقەوە یە بەلام بۆئەوان، بەلام بەئاسانی دەتوانن شتێك كەبەم شێوەیەنیە دیاری بكەن.

كاتێك كەباوك یان دایك لەبەرانبەر منداڵەكانیان لێبوردەیی دەكەن لە پەچەكداركردنی منداڵەكانیان سەرنج دەدەن كەلەجێگایەكی كارەكەدا رخنەیەك هەیە. منداڵ هەست بەئازاری ویژدان دەكات نەك هەست بە پێزانین بكات. چونكەئەوەی وەریان گرتوە لەروی عشقەوە نەبووە بەڵكوكەفی نەفس بووەو هیچ كەس پێویستی بەوەنیە.

کـــەفی نـــەفس یەکێکەلـــەخراپترین جـــۆری زۆررۆیـــی. چـــــونکە خۆراکێـــــك دەردەکـــــەوێت کەلەبەشـــــێکی بونتانایەهەســـت بـــەبێ بـــەهایی دەکـــات. هـــیچ کـــەس لـــەم کارە سودوەرناگرێت.

بـــەم مانایـــە نیـــە کـــەکاتێ هەنـــدێ جارنـــەتوانین نەخشەبکێـــشین، لەشـــتانێك بکـــشێینەوە. بـــەلأم ئـــەم کارەئیرادەیـــەو هـــەم هەڵبژاردنـــە دەبێـــت لەســـەربنەمای ڕێزگرتن بەنەفس بێت نەك بێزاری بێت لەخود.

*** بەواتایـەکی ترکارێـك کـە ئـەنجامی دەدەیـت گـرنگ نیـــە، بـــەڵکو هۆکـــاری ئـــەنجام دانـــی ئەوگرنگـــە. ئێوەهەمیـــشە دەگەرێنـــەوە ســـەرتەوەرەیەك، بۆنمونـــە ئەوەی کەدەتانەوێت شتێك لەبارەی ئازادی یەوە بڵێن.***

خـــەڵکی هەمیـــشە لـــەقۆناغی هەڵبژاردنـــدان بـــەلأم نایـــان دەوێـــت دان بـــەوەدابنێن. کاتێکـــە بـــەر پرســـیارەتییەکتان قـــــەبوڵ دەکـــــەن وئـــــەوەی کەخۆشـــــتان دەوێـــــت، وەهەڵیدەبژێرن ئازادیە.

*** بەلأم ئـەم کـارە ئارادەیـەکیش کێشەیەو کاتێـك بـیری کاتانێـك دەکەینـەوە دەزانـین کارێـك دەکـەین کـەدواتر***

*بەداخەوەین کاتێ وەکو ڕۆژ ڕوناك بووکە هەڵە دەکەم بەڵام بەهەرحاڵ درێژەی پێدەدەین. بۆنمونە پارچەیەك کێکی زیادە دەخۆین یان لەگەڵ دایکماندا کاتە خۆشەکان دەبەینە سەر دڵم دەخوازێت هاواربکەم. بیرلەهەزاران شت دەدەمەوە کەدڵم دەخوازێت ژیرانە، ڕۆشنبیرانە، بەهاکراوانە وگەورانە کاربکەم بەڵام لەکۆڕینی منداڵانەمەڵسوکەوتم کردبوو.*

بەڵام ئەم ڕوداوانەبۆهەمووکەس دێنەپێش. بۆچی بیری ئەوکاتانەناکەیتەوەکەژیرانەوبەخۆشەویستی یەوە ڕەفتارتانکردوە؟بەجێگای ئەوەی سەرکەوتنەکانتان بێننەوەیادی خۆتان کەلەجێگایەك شکستتان خواردوە ئەوەبەیاد بکەن؟

زۆربەی خەڵکی لەژێرکاریگەری خەوی موگناتیسی خۆیانن و دەینوسێنن بەخۆیانەوە. ئەوانەدەڵێن: من کەسێکی:

١- هیچ و پوچم.

٢- هەمیشەکاری خراپ ئەنجام دەدەم.

٣- توانام نییەکاری زیاتر ئەنجام بدەم.

بــــەجێگای ئەوەپێـــشترخۆی رازی بکـــات کارێـــك دەیــــەوێت ئـــــەنجامی بــــدات مەحاڵـــــە، دەبێـــت ئەووزەخـــــەرج بکـــات. ئەگـــــەرباوەرمان وابێـــت کــەناتوانین کارێــك ئــەنجام بــدەین، کەواتـــەناتوانین کارێــك بکــەین. بــەلاّم کاتێــك کەســوربویت لــەوەی کەئێوەکەســێك نــین کــەبتوانن بــچنەسەرکێوێك یــان لەجێگایـــــە قـــسەبکەن، تەنیاشـــــتێك کـــــەدەیلێین ئەمەیەکەتائێـــستائەم کارانــــەم ئـــــەنجام نـــەداوە. تەنانەت هەندێك کات ئەمەراست نیە،

چــونکە کــاتێ خــەڵکی دەیانــەوێت خۆیــان بــەتوانا ببیــنن لەئــەنجام دانــی کارەکــان، بەشــێوەی لائــیرادی جارجارەئەوکارەکەبەراســـــتی ئـــــەنجامیان داوە پـــــشت گـوێی ئەخـەن. بـەلاّم ئەگـەر بەراسـتی ئـەوکارەیان ئـەنجام نـــەدابێت، تـــەنیا شـــتێك کەلەبارەیـــەوە قـــسەدەکەن رەفتاریانەلــەرابردودا. چ کەســێك دەزانێــت کەلــەداهاتوودا دەیەوێت چی بکات؟

ئەگەر بریار بێت ئێمە هەمووکارانێك کەتائێستا ئەنجاممان نەداون، دووبارەیان بکەینەوە، خەڵکی هەرگیز گۆرانکاری دروست ناکەن بەلاّم خەڵکی بەردەوام لەحاڵەتی گۆراندان وئەمەواتە گەشەکردن. واتە ئەنجام دانی کارانێك کەپێشترهەرگیز ئەنجاممان نەداون وەهەندێك کات پێش بینی ئەنجام دانیان ناکەین.

***من هەرگیزکێوپێویم نەکردوە دڵنیام هەرگیزنامەوێت.**

گومان ناکەم هەرگیز حەزبکەیت کێوپێوی بکەیت. بێ گومان ئەنجامدانی کارێکی ئەسان نیە، کێشەی زۆری بەدواوەیە و بۆ ئەنجامدانی ئەوانە نابێ بوترێت، بەلاّم کاتێك کەخۆت سنووردارت نەکرد، دەتوانیت کاری گەورە ئەنجام بدەیت.

لەبیرمە یەکێك لەهاوکارەدەروونناسەکانم خانمێکی بەمن ناساند. بەلاّم شتێکی لەبارەی نەخۆشی یەکەیەوە بەمن نەوت. نزیکەی ساڵێك یان زیاتر لەگەڵ ئەوداکارم کرد. رۆژێك هاوکارەکەم تەلەفۆنی بۆکردم

وگـــووتی لـــەبازاردا لەگـــەڵ ئەوخانمەداروبەرووبوەتـــەوە وئـــەوی بەتـــەواوی بەخۆشـــحاڵ ودڵخـــۆش بینیـــوە. ئەولـــەمنی پرسـی چیم کـردوە. لـەوم پرسـی کـەچ شـتێك لـــەم ژنەدایـــە ئەوەندەنائاســـایی یـــە. لـــەوەلاَم داهاوکارەکـەم گـووتی: ئەوژنەشـیزو فینیـای هەیـە. بـەلاَم مـن لەمەئاگادارنـەبووم ولەبەرئەمـەش لەگـەڵ ئـەودا وەکـو نەخۆشـێکی شـیزوفینیا مامەڵـەم نـەکردبووو وەئـەو بـاش وەلاَمـــی دابویـــەوە. ئـــەم فەرمانـــە لەلایـــەن هاورەگـــە زبازانـــەوە راســـتە. دەروونناســـان بـــیر دەکەنـــەوە کەچانـــسێکی کـــەم بۆگـــۆرینی بۆچـــونی هـــاو رەگـــەز بازانـــەوە هەیـــە ولەئـــەنجام داســـەرکەوتنێکی کـــەم لـــەم بـــوارەدا هەیـــە. بـــەلاَم هەنـــدێك لەدەروونناســـان ئـــەم بابەتەقـــەبوڵ ناکـــەن و بۆکـــارکردن لەگـــەڵ ئەوانـــدا درێژەئـــەدەن. ئێمـــە باوەرمـــان وایـــە کەهاورەگـــەز بـــازی کەبەراسـتی مەبەسـتیانە گـۆران دروسـت بکـەن چانـسی زیاتریـان بۆئـەم کـارە هەیـە. ئەمرۆسـەرکەوتنی زۆرلـەم بـوارەدا هەیـە سروشـتی هاورەگـەز بـازی نەگۆراوەبـەلاَم بۆچـونی ئێمـە سـەبارەت بەئـەوان گـۆرانی بەسـەرداهاتوە.

مەبەست لەراست وتن هەرئەمەیە، کەسانێك لەقوتابخانەدا لەنێو پۆلەکەیاندا بەقوتابیانێکی تەمبەڵ ناویان دەرکردوە، ئەزانن لەوانەکانیاندا لاوازن، چونکە ئەمە پێشبینی یە کەمامۆستاکانیان لێیا دەکەن. منداڵەکان هەست بەمە دەکەن، بێجگەلەمەش ئەوان هەمیشە بەبێ سەرنج دان بەناویان ناونیشانی پۆل دەزانن کەلەکام جۆرەپۆلدا دائەنرێن. هەرلەبە رئەمەش بیر دەکەنەوە کەچاوەروانی زۆریان لەخۆیان نەبێت. زۆرێك لەقوتابیانی تەمبەڵ تەنیا هێواشن یان خاوەنی کێشەیەکن کەلەبیرکردنەوەدا ناهاو سەنگن. بەلاّم ئەگەر بەدروستی هان بدرێن، دەتوانن باش کاربکەن. ئەمەشێوەی بابەتێکەکەسەرۆکی زندانیان لە مانهاتان ١ لەم دوایانەدا لەبارەی زندانییانەوەوتبوی:

***"ئەگەر لەگەڵ کەسێك دا بەهەمان شێوە کە هەیە هەڵسو کەوت بکەیت، ئەو وەك خۆی بەهەمان شێوە دەمێنێتەوە. بەلاّم ئەگە رلەگەڵ ئەودا بەشێوەیە کەئەبێت ببێت یان ئەتوانێ ببێ، هەڵسوکەوت بکەیت،***

*ڕەنگـە بگۆڕدرێـت وئەوشـتەی کەئـەبێت یـان ئـەتوانێت ببێ، ببێت ".*

ئێمـە هـەمووومان تواناماـان هەیـە زیاترلـەوەی بـیرلێ دە کەینـەوە، ئـەنجامی بـدەین. بەمـەرجێك پـێش هەرشـتێك باوەڕمـان بـەو شـتە هـەبێت کەدەیکـەین. بۆگۆڕانکـاری سـەرەتاو بەرلەهەرشـتێك دەبێگریمانەیـەکی باشمـان هەبێت.

** ئـەم قـسانە وەکووبیرکردنـەوەکی بـاش وچـاك بێنـە پێش چاو. " من ڕۆژبەڕۆژ باشترو چاکتردەبم ".*

*ئـەم جۆرەقـسە ئاژاوەگێرانـە لەئەمـەریکا لایـەن گـری زۆریان هەیە، بـەڵام مـن وابیردەکەمـەوە زیـانی ئـەم قسانە زیـانرە لەسـودیان. دورکەوتنـەوە لەکێـشەکان سـەرکەوتن نیـە بەسـەریاندا. ئـەم کـارە کێـشەکان چارەسـەر ناکـات تـەنیا یارمـەتی خـەڵکی دەدات تالەگـەڵ کێشەکاندا ڕووبـە ڕوونەبنـەوە. لەوانەیەخـەڵکی لـەدەرەوە ئـەوەبپارێزن و ڕویەکـە خۆشـیان هـەبێت، بـەڵام هـەمان کێـشە بەشـان رادەکێشن.*

جێگـای داخـە. بۆچـونی بـاش وچـاك بەراسـتی بـونی نیـە. بـەڵام رەنگـە ئێمـە لـەبارەی ئەوانـەوە زیـادەرەوی و زۆررۆییمـان کردبێـت وەرەنگـە بەهایـەکی کـەممان بۆیـان دانابێـت. کـاتێ پـشت بـەهێزی ئـیرادە دەبەستین وعـەزمی خۆمـان جـەزم دەکـەین، تـەنیا یـەکێك لـەئامێرەکا ن کـەبۆگۆران پێویـستە. سـود وەردەگـرین. ئێوەپێویـستتان بەعـەزم وئـیرادە هەیـە. بـەڵام بەناچـارکردنی خۆتـان بەئـەنجامێکی بـاش ناگـەن. کاتێـك کەهـەوڵ دەدەن کارێـك تـەنیا بـەهێزی ئـیرادە ئـەنجامی بـدەن، ئـەوە رێـز لـەخۆتان نـاگرن. وای دابنـێن کـەدەبێت گـۆران لەسـەرەوە لەئەسـتۆ بگـرن وخۆتـان هانـدەرێکی پێویـستان بۆباشـتر کـارکردن نیـە، بـەڵام هەتانـە! گەشـەکردنی راسـتەقینە تـەنیا لەناخـدا دەبێـت. دەبێـت ئێـوە کـارکردن لەگـەڵ خۆتـا فێـربن و لـەهێزەیئیرادە بۆسـودی خۆتـان سـود وەربگـرن، بـەڵام دەبێـت خۆتـان بەتامەزرۆیـە یـە وە وخوازیارانـە لـەم کـارەدا بەشـداری بکـەن. بـێ گومـان ئەمەبـەم مانایەنیـە کەنـەتوانن لەهانـدەرێکی گونجـاو سـود وەربگـرن. ئـەو هێـزەی ویـستت کەدەتـەوێت ئـەنجامی

بـدەیت لــەبواری ســەرکەوتندا بــەکاری بهێنــە. زۆربــەمان مەبەســتە رەهــاو نامومکنــەکان دیــاری دەکــەین بۆخۆمــان، کەســێك کەوابیردەکاتــەوە وادەزانێــت دەتوانێــت کارێــك ئــەنجام بــدات و پێیۆوایــە لــەخۆی پــچراوەولە پەیوەنــدی دانیە.

دیارەئەمــەش بیربــاوەرێکی خۆپەســەندانەیە چــونکە هــیچ ســنورێکی بۆنەکێــشراوە، کێشمەکێــشی خــۆیی یــەکان لەراســتی دا کۆتــان، بــەلاّم بــەهۆی توانــست و پەیوەنــدی وهەوڵــە راســتەقینەکاندا دەگرنــەوە ئەکەونــە نــاو چــوار چــێوەیەکەوە بۆوێنــە: ئەگــەر بمــە وێــت خــۆم یــەکلایی بکەمــەوە تاببمــە هونەرمەنــدێکی وێنــەکێش بــەلاّم هــیچ ئامادەکاریــەکم نەکردبێــت وتوانــام نــەبێت لــەوبوارەدا ئەوابیرکردنــەوە وهەوڵــەکانم لەونێوەنــدەدابێ ســودە وبــێ ئــەنجام دەبێــت. راســتەقیەلێرەدایە ئەگــەر توانــاو هێزێــك لەئارادانــــەبێت مــــەیل وحــــەزێکیش لــــەئارادا نــــەبێت، خواسـتی تـۆ نایـەوێت کارێـك بەئـەنجام بگەیـەنێت چـونکە بەتــەواوی پێــی بێگانــەو نامۆیــە، بــەڵکو دەەوێــت توانــستە بــەهێزەکانی بناسـێت. هەڵبەتــە هــەموو کەسـێك دەتوانێـت

چ کارێـك ئـەنجام بـدات چ کـارێکیش ئـەنجام نـەدات کەواتـە ویـستی هەیـە لـەکردنی هـەر کارێکـدا، لەهـەمان کاتـدا ئـەتوانن بەویـستی خۆیـان بیرکردنـەوەی سەرسـور هێنـەرو نامۆیـان هـەبێت لێـرەدا تـەنیا بیردەکەنـەوە نـەوەك کـارێکی واقعـی. کاتێـك سـودمان لـە هێـزی نـاوە وە وەرنـەگرتبێت بۆگەیـشتن بەمەبەسـتێك، بـەڵکو تـەنیا لەبەررەزامەنـدی وخۆشـحاڵی بەرانبـەرەکانمان کارێکمـان کردبێـت، ئەوەلەراسـتی دا کـارێکی گێلانەیـە. ئەشـێ کەسـانێك بناسـین هێزێکـی بـێ وێنـەی دەرونیـا ن هەیـە، بـەبونی ئـەو هێـزە وبـێ هەوڵـدان دەبێتـە تەقەلایـەکی بـەهێز، بـەلآم ئـەنجامی ئـەو بەهایـە نابێتـە هـەوڵ وکۆشـش، ئەوانـە کەسـانێك نـین کەئێمـە بونمـان لەگـەڵ ئەواندا وەتەنانەت خۆیان لەبونی خۆیان چێژوەر گرن.

***لەگـەڵ ئـەم بونەشـدا هێـشتا کەسـانێك کەپێـشتر ئەلـەکی بـوون، ئـەم کاریگەریـە لەسـەر لایـەنی بەرانبـەر دادەنـێن. دەتوانیـت گوشـارو هـەوڵی زۆر لەوانـدا هەسـت پێ بکەیت.***

***ئەمەبۆئەوان زۆر گران تەواو دەبێت، بەلاّم ناتوانیت بڵیت ئەم هەوڵە نرخی نیە وەیان ئەوەی کەهۆی بۆخواستی راستەقینە بۆئازادی ورەهایی نیە.***

بەڵێ راستە. کێشەی ئەوانە ئەمەیە کەزۆربەیان وزەی خۆیان خەرج دەکەن لەشەر دژی ئەوەی نایان نەوێت ببن، بەجێگای ئەوەی ئەووزەیە لەوەدا خەرج بکەن کەئەیانەوێت ببن. ئەوانە هەنگاوی گرنگیان ناوە بۆهاتنە پێشەوە بەلاّم دەبێت لەوێدابچنەپێشەوە وبەرێگای خۆیاندا درێژە بدەن. شتێك کەدەمەوێت بیلێم ئەمەیە کەئەگەر دەمانە وێت تەواوی ئەو شتەبین کەلە ناخماندایە، دەبێت بەتەواوی ئەو پێویستییانەوە کەلەبەر دەستماندان، سود وەر بگرین، واتە لەهەستمان، شایەتی دۆزینەوەی هۆش وبیر، هێزی ئیرادەو هەمووخۆمانین. ئەگەر لەم کارە سەرکەوتوویوین ئەنجامی کارێکی گەورە دێتە بەرهەم.

****کەواتە بۆچی ئەم کارە ناکەین؟ بۆچی کەسانێك کەبەم جۆرە دەژین، کەمن؟***

چـونکە پاداشـتی شـاراوەیش لەدرێـژەی سـەرنج دان دا، دێتـەبوون ئێمەبـەرەنج کێـشان، ئاشـناین وعادەتمـان پێـوەکردوە، رەنـج کێشان هەستی ئاسودەیی مـان پێـدە بەخـشێت تـاوەکو شـێوازە کۆنـەکان کەهەمیـشە تاوانبـارن بەشکـــست، درێـــژەپێ بـــدەین و لـــەوەبگوزەرێین رووداوێکی ناخۆش بگۆردرێت بە رووداوێکی خۆش تر.

ئێمــە دزانــین چــاوەروانی چ شـتێك بـین. بــەم کــارە دونیـــایی یـــەمان شـــیاوی دەرك وتێگەیـــشتن دەبێـــت وبەشـــێوەیەکی تـــر شـــیاوی کـــۆنترۆڵ کردنـــە. یەکێلـەزۆرترین شـتەکان کەخـەڵکی پێویـستیان پێیـەتی، ئەمەیـە کەهەسـت بکـەن، لەدونیایەکـدا کەشـیاوی هەسـت وتێگەشـــتنە، دەژی وەئەمـــە یـــەکێ لـــە راکێـــشانەکانی وزەیـە. بـەم هۆیـەوە خـەڵکی ئـەمرۆ ئەوەنـدە پەرێـشانن، نـەك تـەنیا تونـدو تیـژی دەوروبـەری ئێمـە بـەڵکو بـێ مانـاو مفهـــوم بـــوون نـــی ئـــەم تێگەشـــتنەش، لەوناوەدایـــە. ئیترهـــیچ شـــتێك لەگـــەڵ یەکـــدا ســـازگارنایەتەپێش چـــاوو وسەرنج دانی رابردوئیتر بەکار نایەت.

***خەڵکی ئیتر نازانن لەسەر چ شتێك دەتوانن حسا ب بکەن. هەمووشتێك بەناثارام و دوو دڵی دێتە پێش چاو.**

پەرێشانی کۆمەلاْیەتی ترسناکە. بەلاْم پەرێشانی زهنی بەپلەی یەکەم ترسناك تردەبێت. بەلاْم هەرلەسەرەتاوە هەوڵ دەدەین ئەم پەرێشانی یە سەرو سامان بکەین.

هەروەك ئێمە هەموومان لەشێوەی دروست کراوێکین. پلە بەپلە وێنەی ناخ لە دونیادا بۆخۆمان دروست دەکەین کەلافاو پالْی پێوە دەنێی لەدەرەوە هێرشمان بۆدەهێنن، پلە بەندیان دەکەن هەندێك لەوانە باش، ن وخواستی ئارام وهەندێکی تریش خراپ و ترسناك ناویان دەنێن. ئێمە پلان دادەنێین کەهەندێك لەکارەکان، ئێمەدەگەیەننەئەنجامی دلْخوازمان وهەندێکی تر ئێمە دوچاری کێشە دەکەن.

***چۆن ئەم رووداوە رودەدات؟**

هەریەك لەئێمەجۆرێك گریمانەکاری دروست دەکەین کەدەلێن:"ژیان هەرئەمەیە ". ئێمە ئەم کارە کاتێ

کـەلاوین، ئـەنجامی دەدەیـن وئـەم گریمانەیـە زۆرزۆر نـویَ گـەری وداهێنـان کـاری یـەو بەراسـتی یارمـەتی مانـەوەی ئێمـەدەدات. کێـشەکەلێرە دایـە کەلـەزۆر جێگـادا ئێمەبـە تێپـە ربـونی کـات وبەدەسـت هێنـانی ئـەزمون ئالـەم پـێش بینـی یانـە بۆچـون تازەناکەینـەوە، بـەڵکو هـەولَ دەدەیـن ئەزمونەتازەکان لەهەمان درزی پێشودا جیَ بکەینەوە.

**** دڵنیـام کەزۆربـەی خـەڵك هـەبونی وەهـا گریمانەیـەك نکوڵی دەکەن.***

***لەوانەیـە ئەوانـە کاریگـەری، دەمارگیریـان لەسـەر ئـەوە هـەبێت کەپەیوەنـدی بـەوەوە هەیـە کەلـەکاتی منداڵیانـدا بۆیان پێش هاتبیَ، وەربگرن، بەلاَم گریمانە نا.***

زۆربـەی خـەڵکی نـازانن زیـاتر چ جـۆرە گریمانـە یـەکیان هەیـە، چـونکە هـەرگیز ئەوانـە بەزاریانـدا نـەهاتوە. ئەوانـە کۆمـــەلێك لـــە هەســـتی شـــاراوە، ترســـی ئاشـــکرانەکراو شـتانێکن کەئێمـە نـەمان وێـراوە تەنانـەت لـە منداڵیـشدا، لـەبارەی ئەوانـــەوە قـــسە بکـــەین ویـــان دان بـــەبوونیان دا بنـێین. ئەوانـــە بـــە بـــە هێزتـــرین ودژوار تـــرین هێزیـــان، لـەژیانی مرۆڤـدا وەکووپەیوەنـدی سێکـسی، تونـدو تیـژیو

هێــرش کردنـــە ســـەر ســـەرو کاریـــان هەیـــە کەزۆربـــەی خێزانـــەکان ئـــەوان بـــەتر ســـناکتر لـــەوە دەزانـــن کەلـــەبارە یـــەوە قـــسەبکەن. هەرلەبـــەر ئەمەشـــە کەئێمـــە لـــەبارەی خـــودی واقعیـــەت، تێگەیـــشتنێکی ئـــاڵۆز دروســـت دەکـــەین کەهـــەرگیز ئـــەومان بـــەیان نـــەکردوە وەیـــان لێکۆڵینـــەوەمان لەســـەر نـــەکردوە. ئێمـــە هـــەر ئـــەم کـــارە دەکـــەین. ئێمـــە لـــەنێوان حـــە ووبێداریـــدا جیهـــان بینـــی خۆمـــان دروســـت دەکـــەین وئیـــزن دەدەیـــن ئـــەم جیهـــان بینـــی یـــەوەکو عەدەســـەی ڕەنگـــی بێـــت، ژیـــانی ئێمـــە ڕەنگـــین دروســـت بکات.

***مەبەســـتتان ئەمەیـــە کـــەگرنگترین بـــاوەر لـــەبارەی ژیانـــەوە، ئەوانـــەن کەئێمـــە تەنانـــەت ئاگامـــان لەوانـــە نیـــە ولـــەقۆناغی منداڵیـــدا ئەوانـــە لەگـــەڵ خۆمانـــدا هـــەڵ دەگرین؟***

بـــەڵێ کاریگـــەری ئەوانـــە دەتوانێـــت زۆرگـــەورە بێـــت. زۆرجـــار کـــاتێ بیردەکەینـــەوە ســـەبارەت بەکەســـەکان و ڕوداری ڕاســـتەقینە کاردانـــەوە پیـــشان دەدەیـــن، لەراســـتی داتـــەنیا ڕۆڵـــەکان بەوانـــەدەدەین کەلەچـــیرۆکی ناخمانـــدا

تەواویتەمەنمان سەرقاڵی وێنەکێشانیان بوین. بۆوێنە ئەگەر کەسێك لەمندالی دا هەستی کردبێت کەلەلایەن گەورەکانەوە بەگرنگ دانراون ولابراون، ئەم فەرمانە لەشێوەی تێرامانی ئەو بەدونیا ئەزمونێکی گرنگی باش بێت، رێگای زۆرهەن کەئەو دەتوانێنت درێژە بەم ئەزمونە بدات. رێگایەکی گەران هە یە، کەسێك حەز دەکات ئەو بەکەسێکی بەهەند وەرنەگیراو بزانن وحسابی بۆنەکەن ئێمەهەموونەمەبەباشی وەردەگرین. رێگایەکی تر هەلاتنی خەڵکی یە لەرەفتارەکانیان.

یان ئەوەی کەئەو دەتوانێت پێش بینی ئەوە بکات کەبەهەند نەزانراوە لەحاڵێکدا کەبەراستی ئەمە رویی نەداوە. هەریەك لەم رێگایانە کەهەڵ دەبژێردرێن، گریمانەکەی لەبارەی ئەوەوە کەچ چاوەروانی یەکی لەخەڵکی هەیە، رەزامەندی دەردەبرێت و ئەمە جێگای خۆشحاڵی یە.

***بەلام زۆرسەرنج راکێش نایە تەپێش چاوو.**

دەزانم کەپێت سەیرە. راست و رەوان کارکردن باشترین ئەزمونە لەدونیادا یان باشترە بڵێن هەڵە کردن

ناخۆشـــترین ئەزمونـــە کـــەدەتوانێت بـــۆمرۆڤ روبـــدات. ئەمەلێـــدانێکی ئازاربەخـــشە بـــۆمرۆڤ کەهەســـت بکـــات، هەڵـــەی کـــردوە، هەرلەبەرئـــەم هۆیـــە شـــە کەخـــەڵکی نایانـــەوەێت گۆرانکـــاری دروســـت بکـــەن، چـــونکە گـــۆران بەمانای داننانە بە هەڵەدا.

رۆژێك نەخۆشێکی شلەژاو قیژاندی بەسەرمدا:

*"ئەمـەیانی مـن٤٠ سـاڵی سـەرەتای تەمـەنم بەهـەدەر داوە".*

هەنـــدێك لەخـــەڵکی بەباشـــی دەزانـــن، درێژەبـــدەن بەهـــەمان هەڵـــەی ٤٠ ســـاڵی رابـــردوو، تـــاوەکو دان بـــەوەدابنێن وقـــەرەبووی زیانەکـــەی بکەنـــەوە. خـــەڵکی زۆر کەلەشـــەقن. هەنـدێك کـات ئەوانـــە لەدڵـداباوەریان هەیـــە کەئەگـــەر بۆماوەیـــەکی پێویـــست بـــەکرداری خۆیـــان درێژەبـــدەن، ئـــەوکردارە بـــاش دەبێـــت. ئەوانـــە گومـــان دەبـــەن راســـتی لەبەرانبـــەررێگای ئەوانـــدا خۆبەدەســـتەوە دەدات بـــەجێگای ئـــەوەی کەکاردانـــەوەی ئـــەم فەرمانـــە شتێکی لێوەرووبدات.

